# بنج و بناوانی هەندێ وشە

د. ئەورەحمانی حاجی مارف

- بەشی یەکەم -

بەغدا - ٢٠٠٠

# پێشەکی

ئێتیمۆلۆژی ئەو بەشەیە لە زانستی وشە ، کە لە پەیدابوون و وەرگرتن و گەشەکردنی وشە و ئەو دەورانەی پێیدا تێپەڕیوە دەدوێ.

وشەکانی زمانی کوردی قاڵ بۆوەی ساڵانی دوور و درێژی مێژووی گەلی کوردە و سۆرە و تۆرەی چەندین پلە و قۆناخی هەڵس و کەوتی باری ژیانی هات و نەهاتێتی. لەو ماوە درێژ و بەرفراوانەدا کە بە سروشت لە کەو دراون و گێژە کراون و گورگە و بنژێل و زێوانیان لێگیراوە ، لە زۆر ڕووی گرنگەوە پتەو بووە و بە خۆدا هاتۆتەوە و دەوڵەمەند بووە .

پەیدابوون و گەشەکردنی وشەکانی زمانی کوردی ، وەکو هەموو زمانەکانی سەر ڕووی ئەم زەمینە لە دوو ڕێگەوە سەری هەڵداوە. یەك ـ ڕێگەی ڕاستەوخۆ، کە ئەویش هەڵێنجانی وشەی کوردیی ڕەسەنە لە نێو زمانی کوردیدا ؛ دوو ـ ڕێگەی لاوەکی ، کە ئەویش وەرگرتنی وشەیە لە زمانی بێگانەوە.

بەم جۆرە لە لێکۆڵینەوەی ئێتیمۆلۆژیی زمانی کوردیدا ، پێویستە بەتایبەتی بنجی زمانی کوردی ساغ بکرێتەوە ؛ وشەی ڕەسەنی کوردی و وشەی ئێرانی و هیند و ئەوروپایی دەست نیشان بکرێن ؛ وشەی بێگانە و ڕەگی بێگانە لە زمانی کوردیدا دیاری بکرێن ؛ چالاکی و سستی وشەکانی زمانی کوردی بخرێنە پێش چاو...هتد.

بەو پێیە ، هەوڵ دەدەین ماك و بنەما ؛ ڕەگ و ریشە؛ ڕەگەز و بنچینە ؛ بنج و بناوان ...ی هەندێ وشەی زمانی کوردی لەو شێوەیەی ئەمڕۆیدا کە هەیە ، لێك بدەینەوە و بەپێی توانست لەگەڵ زمانانی خزم و بێگانەدا بەراوردیان بکەین.

## ئاگر:

لە شـێوە جۆربـەجۆرەکانی زمـانی کوردیـدا ئـەم فۆرمانەی خوارەوەش بەکاردێنرێن :

ئاور ، ئینگـر ، ئـاهر ، ئایـەر ، ئـار ، ئـایر ، ئاتـەر ، ئادر، ئاتەش...

ئاوێستا : ئاتەر

پەهلەوی : ئاتەرش

## تێبینی :

* (تـە)ی (ئاتـەر)ی ئاوێسـتا بـووە بـە (گ) و وشـەی (ئاگر)ی لێ کەوتووەتەوە .

هەرچی وشەکانی دی‌یە (تە)ی ئاوێستا :

١. بووە بە (و ، هـ ، ی ، د ، ت ، یە)




٢. تیٚچووە :

ئاتەر . ئا (تە)ر > ئار

۳ . ماوەتەوە

ئاتەر - ئاتەر

* (ئا)ی ئاوێستا بووە بە (ئیٚ) :

ئیٚگر

*(ر)ی پەهلەوی تیٚچووە و (ئاتەرش) بووە بە (ئاتەش)

## ئاباد :

- ئابات ، ئاوا ، ئاوەدان ...

١ . لە زمانە ئیٚرانییەکاندا وەك مۆرفیٚمیٚکی بەند بە دوا ناویٚکدا دیٚ و یـاریدەی ڕۆنـانی نـاویٚکی نـویٚ دەدا بـۆ ناونـانی شـار و دیٚ : ئیسـلام ئابـاد ؛ جـەلال ئابـاد ؛ عەشق ئاباد ...

۲ ـ لە کورردیدا :

ا ) بـە زۆری بـە هـەمان چەشـنی زمانـانی خزمـی ، خۆی دەنویٚنیٚ : مەهاباد...

ب ) بـە تـەنیاش لـە شـیٚوەی ئاوەڵنـاوی سـادەدا بەکاردەبریٚ . ئەوەتە مامۆستا هیٚمن دەڵیٚ :

وەك بەهەشت خەملیوە خاکی پاکی کوردستانی ئازاد

موڵکی ئازەربایجانیش بۆتەوە مەعموور و ئاباد

## بازاڕ :

فارسیی کۆن : ئەبا جاڕی

پەهلەوی : ڤاچاڕ

(ڤ)ی پەهلەوی لە کوردیدا بووە بە (ب)و

(چ)ش بووە بە (ز) :

ڤاچاڕ > بازاڕ

(ئەبا)ی فارسیی کۆن لە سانسکریتیدا (سەبهە)یە ، کە واتای (شوێنی کۆبوونەوە) دەگەیەنێ.

کەرتی دووەمی لە چاوگی (جەڕی)یەوەیە ، کە واتای (لەوەڕان) دەدات .

وا پێدەچی وشەی (شار)یش هەر لە (زاڕ) - (چاڕ) =(جار)ی‌یەوە کوتبێتەوە . ئەوەتە لە دیالێکتی ژووروی کوردیدا بە (شار) دەوترێ (باژێڕ) .

## ئارەزوو :

- ئارزوو ، ئارەزۆ ، ئارزی ، واز ، حەز...

ئاوێستا : ئازی

پەهلەوی : ئارزۆك ، ئارزووك ، ئاهووك

سانسکریتی : ئازەڤ

**تێبینی :**

١ . لە ئاوێستا و پەهلەوی و سانسکریتی و گشت دیالێکت و بەشە دیالێکتەکانی کوردیدا (ئا)ی سەرەتای وشەکە وەك یەکە و هیچ گۆڕانێکی بەسەردا نەهاتووە .

٢ . لە پەهلەوی و کوردیدا :

أ ) لە نێوان (ئا)و (ز)دا (ر) پەیدابووە .

ب ) دەنگی (ی) بووە بە (وو) ، یان (ۆ).

٣. لە هەندێ شێوەی کوردیدا (ی) کۆتایی وەك خۆی ماوەتەوە . (ئارزی).

**ئادەم :**

بە (عیبریی کۆن) واتای (مرۆ ، مرۆڤ ، مەردووم ، ئینسان ، بەشەر) دەدات .

ئادەمیزاد =

ئادەم + ی + زاد (نەوە)

واتە ـ ئەو کەسانەی لە ئادەم کەوتوونەتەوە .

**ئەبەنووس :**

= ئابەنووس ، ئابنووس ...

لە وشـەی (EBENOS)ی گریکی‌یـەوە وەرگـیراوە ، کە واتای (داری ڕەش) دەگەیەنێ.

فارسی : ابنوس

## ئارام :

- ئۆخـژن ، ئۆقــرە ... ســرەوت ، ســەبر ... تــوان ، توانست ... وزە ، هێز ... لەسـەرخۆ ، هێمن ... خـامۆش، بێدەنگ ... بەئەسپایی ، بەنەرمی ...

ئاوێستا : ئارەم

(ئا) پێشگرە بۆ جەخت کردن + (رەم) قەدی چاوکی (حەسانەوە)یە .

سانسکریتی : رامەیەتی

فارسی : ارام

*(ئارەم)ی ئاوێستا چ لە کوردی و چ لە فارسیدا تەنیا دەنگی (ە)ی گۆڕراوە بە (ا) .

## ئەژدیها :

= ئەژدەها ، هەژدەها ، هەژدیها...

ئاوێستا : ئەژی‌دەهاکە . پێکهاتووە لە :

(ئەژی) - مار

(دەه)  =ژەهراوی ، گەزندە ، ئازاردەکە

(اکە)  - خراپ

ئەگەر لەگەڵ (ئەژدەها)ی کوردیدا بەراوردی بکەین ، دەبینین (ی)ی (ئەژی) و (کە)ی کۆتایی تێداچوون .

## ئاهەنگ :

- بەزم ، شایی ، گۆڤەند ،ڕابواردن ، خۆشی...

ئاوێستا : ئاتەنگ

پەهلەوی : ئاهەنگ

لەم وشەیەدا تەنیا دەنگی (ت) گۆڕاوە بە (ه)

## ئازووخە :

- ئازۆخە ، ئازووقە ، تفاق ، زەخیرە...

ئاوێستا : ئازووئیتی ، ئازووتی  - چەوری ، خواردەمەنی

## ئاخەلێوە :

- خاکەلێوە ، ئاخلێڤە

یەکەم مانگی بەهار ، سەرەتای بەهار

ئاخ - خاك

واته كاتێ شینایی به ئاستەم سەردەردێنێ و لەو سەردەمەدا ، كه ئاژەڵ دەلەوەڕێ ، خۆڵ و گیا پێكەوە هەڵدەگرێ ، ئاخ (=خاك) به لێویەوە دیاره .

## ئاران :

له كوردیدا بەم مانایانە دێت :

١. زستانەوار ، گەرمەسێر ، قشڵاخ...

٢. لەوەڕگا... مێرك... پاوان...

٣. دەشت ، تەختانی ، تەختایی...

٤. گۆشتەزەوی ، نەرمان...

٥. چۆڵ... هەرد... سارا...

## تێبینی :

به زمانی لاتینی (ئارێنا) به واتای حەرفی (خۆڵ) دەگەیەنێ . له ڕۆمای كۆن گۆڕەپانێكی دائیری یان هێلكەئاسایی خۆڵ بەسەردا ڕاخراو له ناوەندی (ئامفی تیاتر)ی بینای بینەراندا بۆ نیشاندان و بەگژ یەكدا كردنی كۆیلە و ئەسیری جەنگ و گیانلەبەری دڕندە بەكاردەهێنرا . (ئارێنا)ی لاتینی له فەرەنسیدا بووە به (ئارێن) و له ڕووسیدا (ئەرێنه) .

**مێش :**

= مەشی ؛ مەگەز

ئاوێستا : مەخشی

پەهلەوی : مەگەس ، مەکەس

* وا پێدەچێ (مێش ، مەشی) لە (مەخشی) ئاوێستاوە کەوتبنەوە و (مەگەز)یش لە (مەگەس ، مەکەس)ی پەهلەوی‌یەوە.

**ماسی :**

= ماهی

ئاوێستا : مەسیە

پەهلەوی : ماهیك

بلووجی : ماهی

ئەفغانی : ماهەی

سانسکریتی : مەتسیە

**گەروو :**

= ئەوك ، قورگ

ئاوێستا : گەرەھ

پەهلەوی : گەرووك

فارسیی نویٚ : گلّوو

سانسکریتی : گەلە

لاتینی : گولّە

ئەرمەنی : کول

ئەفغانی : گارە ، غارە

ڕووسی : گۆرلّە

## کەنی :

- کەنیشك ، کیژ ، کناچە ، کناچی ، کچ...

ئاوێستا : کەنیا ، کەینین ، کەینیکا

پەهلەوی : کەنیك

سانسکریتی : کەنیە

## نەمر :

- زیندوو

پێکهاتووە لە ئامرازی (نە)ی نەریٚ + (مر)ی ڕەگی کرداری (مردن) .

ئاوێستا : ئەمرتە

پێکهاتووه له ئامرازی (ئه)ی نەرێ + (مرته) ، که قەدێکه واتای (مەرد) یان (مردوو) دەدات .

**ئەفسەر :**

- زابت ، زاووت

ئەم وشەیه له ڕێی زمانی فارسییەوه هاتووەته کوردییەوه .

له (ئەفیسێر)ی ڕووسی و(ئوفیسیه)ی فەرەنسی و (ئۆفیسەر)ی ئینگلیزی ... وەرگیراوه . ئەوانیش له ( ئۆفیسیووم)ی لاتینی‌یەوه بە مانای (فەرمانبەری گشتی)یان وەرگرتووه.

**بەفر :**

کرمانجی ژووروو : بەرف

ئاوێستا : ڤەفره

پەهلەوی : ڤەرف

فارسیی نوێ : بەرف

**تێبینی :**

١. دەنگی (ڤ)ی ئاوێستا و پەهلەوی له گەڵ وشەی کوردیدا بووەته (ب) .

٢. (بەڤر)ی کرمانجیی خواروو دەچێتەوە سەر ئاوێستا و (بەرف)ی کرمانجی ژووروو و فارسی دەچێتەوە سەر پەهلەوی .

## ئینجیل :

یۆنانی : ئێڤانگێلیۆن

- مزگێنی ؛ خەبەری خۆش

## ئیبلیس :

عەرەب لە یۆنانی‌یەوە وەری‌گرتووە (دیابۆلۆس) بە یۆنانی واتای (درۆزن ، دووزمان) دەگەیەنێ .

## ئەسرین :

- فرمێسك ، ئەسر ، ئەسروو

ئاوێستا : ئەسرەڤ ، ئەسروو

پەهلەوی : ئەرس

## تێبینی :

١ . لە هەندێ شوێنی کوردستان (ئەسروو) دەوترێ کە ئەمە تەواو لەگەڵ ئاوێستاکەدا یەك دەگرنەوە .

٢. لـه (ئەسـر)ی هـەندێ هـەرێمی کوردەواریـدا تێداچوونی (ەڤ) یان (وو)ی کۆتایی دەبینرێ.

٣. بۆ (ئەسرین)یش وا پێدەچی (ەڤ) یان (وو) بووە بە (ین).

## ئەمبار :

- عەمبار...

ئاوێستا : هام پەر

پەهلەوی : هەنبار

(هامپەر)ی ئاوێستای بە مانای (ئاخنین ، پڕکردن و داگرتن) دێت .

- وا پێدەچێ عـەرەب لـە زمانـە هینـد و ئەوروپاییەکانەوە وەریان گرتبێ .

## بەگ :

ئاوێستا : بەغە ، بەگە ، خوا

پەهلەوی : بەگ - خوا

عەرەبی و فارسیی : بێگ

تێبینی :

١. لە کوردی و فارسی و عەرەبی و تورکیدا ماناکەی گۆڕاوە.

٢. قاڵبە کوردییەکەی بەتەواوی وەك پەهلەوییە. هەرچی فارسی و عەرەبی و تورکییەکەیە، جیاوازییان لەگەڵ پەهلەوییەکەدا هەیە.

٣. لە زمانی ڕووسیدا (بۆگ) بەمانای (خوا) دێت .

بووم :

= زەوی ، خاك

ئاوێستا : بوومی

پەهلەوی : بووم

سانسکریتی : بهوومی

وشەی (بووم) لە کوردیدا لە بیرچووەتەوە و بەتەنیا بەکار نایەت . ئێستا تەنیا لە دوو وشەی (بوومەلەرزە) و ( بەروبووم)دا دەبینرێ .

مردن :

ئاوێستا : مەر

فارسیی کۆن : مەر

سانسکریتی : مەر

پەهلەوی : مورتەن

بلووجی : میرەگ

فارسی : مورده

*(موت)ی عەرەبی لە (مورتەن)ی پەهلەوییەوە نێزیکە. واتە عەرەبییەکە لە دەنگی یەکەم. (م)و دووەم. (و)و سێیەم ـ (ت)ی پەهلەوی پێکهاتووە.

ژیان :

ئاوێستا : زیانی ، زیانا ، جیانو

سانسکریتی : جیەنە

پەهلەوی : جان

فارسی : جان

ئەفغانی : زیان

بلووجی : زیانی

ئەرمەنی : زیەن

ڕووسی : ژیزن

*تەنیا لە کوردی و ڕووسیدا دەنگی یەکەم بووە
بە (ڤ).

**ئامین :**

بنجی ئەم وشەیە عیبریی کۆنە و دەقاودەق واتای (ڕاستە ، وایە ، تەواوە...) دەگەیەنێ .

**ئوتوو :**

کورد ئەم وشەیەی لە زمانی ڕووسی‌یەوە وەرگرتووە.

به ڕووسی (ئوتیووك)ی پێدەوترێ.

ڕووسیش لە تەتەری وەرگرتووە .

بە تەتەری (ئەتەك)ە .

**سەماوەر :**

وشەیێکی ڕەسەنی ڕووسی‌یە ، کە پێکهاتووە لە :

(سام + ە + ڤار)

(سام) - خۆ

(ە) = ناوبەندە (سام) و (ڤار)ی بەیەکەوە بەستووە.

(ڤار)- ڕەگی کرداری (ڤاریت)ە - کوڵ . کوڵان

کەواتە (سەماوەر) دەقاودەق واتای (خۆکوڵ ، خۆکوڵێن) دەگەیەنێ.

## هەشت :

- ئەشت

ئاوێستا - ئەشتە

پەهلەوی - ئەشت ، هەشت

سانسکریتی - ئەشتەو

*شێوەکانی ئەم وشەیەی کوردی بەتەواوی لەگەڵ شێوەکانی پەهلەویدا یەك دەگرنەوە.

## هەشتا :

- ئەشتا

ئاوێستا : ئەشتایتی

پەهلەوی : ئەشتات ، هەشتات

فارسی : هشتاد

بلووجی : هەشتاد

*وشەی (ئەشتاتی) ئاوێستا ، کە بە یاریدەی پاشگری (تی) سازبووە ، وا پێدەچێ لە زمانی پەهلەویدا (ات)ی ئێرانی وەرگرتبێ : (ئەشتات.

هەشتات) . لە زمانی فارسی و بلووجیدا (ت)ەکە بووە بە (د) . (هەشتاد) . لە زمانی کوردیدا (ت) تێداچووە و (ا) ماوەتەوە و وشەکە بووە بە (ئەشتا ، هەشتا).

## بۆسۆ :

لە دوو مۆرفێم پێکهاتووە :

١. بۆ - بۆن ، بێن ، بێهن

ئاوێستا : بەئۆذی

پەهلەوی : بۆذ ، بۆی

گەرچی ئەم وشانە لە ئاوێستا و پەهلەویدا هەر بە بۆنی خۆش وتراوە ، بەڵام ئەمڕۆ لە کوردیدا بە هی خۆشیش و ناخۆشیش دەوترێ.

٢. سۆ (سووتان) - ئاگرتێبەربوون

## تێبینی :

١. لە ناوچەی هەولێر دەوترێ : (بۆنسۆ) ؛ لە کرمانجی ژووروودا : (بۆسی).

٢. واتاکەی : بۆنی لۆکە و پەڕۆی سووتاو بەڵام بە (بۆنی چێشتێ ، کە بە بنی مەنجەڵەوە سووتابێ و لە کاتی خواردنیدا هەستی

پیێبکرێ... یاخود تامی ماستێك شیرەکەی زۆر کوڵابێ...) دەوترێ : (بۆکن) ... (بۆنی سووتانی هەندێ شت ، کە لە گیانداران دەکەونەوە ، وەك: خوری ، موو...)ش دەوترێ : (بۆکرووز ، بۆپروون).

## ئاخوڕ :

ئاوێستا : ئا ـ کوەرە

پەهلەوی : ئاخوەر

فارسی : اخور

لە کوردیدا ئەم وشانەش : (ئافر ، ئافڕ ، ئافەرە، ئاووڕ ، ئاهویر ، ئاڵفدان ، ئاخۆڕ ، ئاخڵ ، ئاخڵە ، هەڤش...) هاوواتاین .

قوش قوشی ڕاوی نەبێ ، مورغی کولانە و ئاخورە
سەگ سەگی تازی نەبێ ، کادینی‌یو ئەنبارییە
(نالی)

مەیتەر و زین و تەویلە ، ئەی برا لازم نییە
ئاخوڕ و ڕەشمە و لغاوی هەروەها پێویست نییە
(بێکەس)

## ئیدیۆم :

ئاخوڕی بەرزە =

بە یەکێك دەوترێ لووت بەرز و بە فیز بێت .

ئاخوڕی خوارە -

١. بە کەسێکی دەستبڕ و تەڵەکەباز و ناپاك دەوترێ.

٢. کاری چەوت و چەوێڵ و چەواشە .

٣. مرۆی دووڕوو و دووزمان .

ئاخوڕی خۆی لێ تێك چووە -

لە خۆی بایی بووە . لە خۆی گۆڕاوە .

ئاخوڕی چەورە -

بە کەسێك دەوترێ ساماندار و تێروتەسەل و سایە چەور بێت .

## ئازا :

ئاوێستا : ئەزامی

فارسی : شجاع

لە کوردیدا ئەم وشانەش (بوێر ، بەجەرگ ، جـامێر ، جوامێر ، دلاوەر ، دلێر ، گەڕناس ،

نــــەترس ، ئــــەگیت ، مێرخـــاس ، مــــەرد ...) هـاوواتاین .

نییە دەخڵم لە شانامە و مەصافی ، غەیری ئەم نوکتە
کـە کـوشتەی بەندی تۆیە هەر کەسێ ئازاد و ئازا بێ
(نالی)
لـە پێشا خاکـی مە لانەی پڵنگ و شێری ئـازا بـوو
ئەمێستا مار و مێروو ، گورگ و ڕێوی لێی دەکەن سەیران
(حاجی قادری کۆیی)

(ئـازا) بـە مـانای نـاڕاستەوخۆش بەکـاردێنرێ ، کە واتـای (چاپووك ، چالاك ، چوسـت ، بـەتاو ، بـەگوڕ ، خۆشــڕەو ، خــێرا ، گــورج ، تونـد ، پتــەو، پــەیت ...) دەگەیەنێ .

بەرانبەر ئەم واتایەی لە ئاوێستادا : (ئازوو ، ئاسوو) هەیە .

## ئیدیۆم :

ئازا گۆ و ئـازا مـەیدان = واتـا هـەی لـە گوتنـدا ئـازا ، ئەوە مەیدان ... بۆ هاندانی یەکێك دەوترێت ، کە بە قسە تەواوبێت و لە کرداردا سست بێت .

## ئاراسته :

له زمانی کوردیدا وەك دوو وشەی هاوبێژ خۆی دەنوێنێ :

١. له پەهلەویدا : (ئاراتەك)ە و چاوگەکەشی (ئاراستەن)ە و له کوردیدا بووه به (ڕازاندنەوە). واته:

أ) خەملاوە ، جوانکراو ، ڕازاوە ، ئارایش کراو...

ب) تەکوزکراو ، ڕێکوپێك کراو ، لەبار...

ج) به سەروبەر ، ئامادەکراو ، سازکراو ، ڕێکخراو... (سوپا و ئووردوو و لەشکر).

د) ئامادە ، دەردەست ، ساز ، تەیار ، حازر

٢. به واتای (ڕووبەڕوو) :

ئاراستەی قەدیم یەد قودرەتم
نەزدیك وە لیقای زات وەحدەتم
(میرزا ئولقادر)

## ئارد :

پەهلەوی : ئارت

فارسی : ارد

له کوردیدا (ئار ، هارد ، ئەرڤان...)یش هاوواتاین.

پیرێژن ئەڵێ : بەفر ئارد بووە

قەدریان نەگرتووە و لە کیسیان چووە

(پیرەمێرد)

## ئیدیۆم :

ئاردی بێژراوە = شتی پوختەکراو ، سازکراو،خەملاوە

## پەندی پێشینان :

ئاردی بێژراوە ، کەپەکی ماوە - واتە باشی ڕۆیوە و خراپی ماوە.

ئاردی ڕۆیوە و سۆسی ماوە - بە شتێك دەوترێ ، کە کەڵکی نەمابێ.

## ئار :

لە زمانی کوردیدا (ئار) وەك چوار وشەی هاوبێژ دەبینرێ :

١ـ بە واتای (ئاگر) :

ئەگەر بە ئاری عەشقەکەت دولبەر بسووتێم دوور نییە

چونکە وەك پەروانە قوربان من پەشێو ئەحواڵی تۆم

(مینە جاف)

مەمێ گۆت : برا ، دلێ من ژ کول و کەسەران وسا تژییە وێ ب ژانە

ژ دلێ من ئارێ حەفت فرنانە

(مەمێ ئالان)

٢ـ لە کرمانجیی ژووروودا بە مانای (ئارد) لە کاردایە:

ئاشڤانچی گۆت : جی هەیە ، لێ نان ل جەم من تونە ، ل ڤرا بوو بە خەلایی ، کەسەك نان نایینە ، ناهێرە ، ئاری من تونە ، کو ژ تەرا نانەکی بپیژم ...

(کوردۆ)

دەوترێ : ئارێ گەنم ؛ ئارێ جەهـ ، ئارێ ب کەپەك

٣ـ لە دیالێکتی ژووروودا بە واتای (شەرم) بە کاردەبرێ ، کە ئەویش لە (عار)ی عەرەبییەوە کراوە بە (ئار) :

شکاند سۆندا خوە و ناڤێ خوەکر دەفتەرا دەرەوینانە
دناڤ خەلکێ دە،ب مە ڤە نەهشت ئار و فەدی تاڤا رووپانە

(مەمێ ئالان)

٤ـ لە هەندێ ناوچە بە مانای (نزار ، نسار ، نسێ ، سێبەر ...) دێت ـ واتە جێگەییێك لە بەرزیی شاخ و کێودا ، کە بەر سێبەرە و هەتاو کەم لێی دەدا ... شوێنێك کە هەتاو نایگرێتەوە .

## ئارا :

دەتوانین چوار وشەی (ئارا)ی هاوبێژ دیاری بکەین :

١ـ به ماناى (ڕازاندنەوە ، جوان کردن ، ڕێکخستن ... ئارایش ، ڕازاوە ، ڕێکوپێك ...) ، کە لە فارسیدا (اراستن)ە .

تەخت ئارا - تەخت ڕازاندنەوە :

تا (سولەیمانان) نەبوونە صەدری تەختی ئاخیرەت
(ئەحمەد موختار)ی ئێمە شاهی تەخت ئارا نەبوو
(نالی)

چەمەن ئارا - چەمەن ڕازێنەوە :

تا نەگریا ئاسمان و ، تەم وڵاتی دانەگرت
گوڵ چەمەن ئارا نەبوو ، هەم لێوی غونچە وا نەبوو
(نالی)

شەو ئارا - شەو ڕازێنەوە :

من و یەك لەحظە شەو ئارام و تاقەت
لە دووری ماهی شەوئارا ؟ فەرموو
(وەفایی)

بەزم ئارا :

من چۆن پەروانان هەر جانفدای تۆم
حەیران جەمین بەزم ئارای تۆم
(وەلی دێوانە)

٢ـ بە واتای (نێوان ، بەین ، ناوان ، مەیدان ...)

ئەوەی دامنا و بە هیوای بووم ، لە بیری کۆنی گەنجیدا
ئەوەی هێزی خەیاڵاتم دروستی کرد لە ئارادا
(ئیحسان فوئاد)

٣ـ بە مانای (ڕا ، بیر ، هزر ... بیروڕا و بۆچوونی کەسێك سەبارەت کێشەیێك ...). لە (أراء)ی عەرەبییەوە وەرگیراوە ، کە کۆی (رأی)یە .

٤ـ لە شێوەی دملکیدا بە واتای (ئەوجار) دێت.

## ئارۆ :

لە شێوەی هەورامیدا بەکاردێ .

پێکهاتووە لە (ئا-ئەم) + (ڕۆ + ڕۆژ)

لە شێوەکانی دیی کوردیدا : (ئاڕۆ ، ئەمڕۆ ، ئەوڕۆ ، ئیمڕۆ ، ئبڕۆ ، ئەڤڕۆ ... ) هاوواتاین.

ئەی ڕەسوول ئارۆ شەوفش پەروازدا
وەناز و ئیعزاز کار تۆ ساز دا
(مەولەوی)

من واتم : درود مەوانە ئارۆ
هەر روکن و مەقام دوعای ویش دارۆ
(فەقێ قادری هەمەوەند)

ئارۆ قیبلۆ من ، بە لەنجە و لارە
تەشریفش وە لای ، تۆ ئامان هارە
(صەیدی هەورامی)

## ئیدیۆم

ئارۆ ، ئارۆن - ئەمڕۆ ئەمڕۆیە ـ واتە : ئەمڕۆ ئەو ڕۆژەیە ، کە لێی دەترسای . ئەمڕۆ ڕۆژی منە .

## پەندی پێشینان :

ئارۆ سەوایش پەندکەرۆ - ئەمڕۆ سبەینێیی پێ دەکا.

## ئاد:

لە زمانی کوردیدا (ئاد) وەك سێ وشەی هاوبێژ خۆی دەنوێنێ :

١ـ لە ناوچەی هەورامان و هەندێ شوێنی دی کوردستان بە واتای (ئەو ـ بۆ نێرینە) دێت :

ئاد مارۆ بەویر تەرزەکەی باڵات
ئەو دیدەی مەستت ، ئێد خاڵ ئاڵات

(مەولەوی)

ماوای ڕەفیقش جە کۆی توون بێ
ئادیچ(١) چوون مەجنوون دەروون پڕ هوون بێ

(لەیلێ و مەجنوون)

ئاد دەماخ دڵ پەرداخ کەردەوە
ئێد سۆز یاران هەم ئاوەردە

(جەفایی)

---

(١)ئادیچ = ئەویش

## پەندی پێشینان :

ئاد سوار و من پیادە - ئەو سوار و من پیادە

ئاد کاروانچی و من خانچی - ئەو کاروانچی و من خانچی

ئەو + ان - ئەوان

لە هەورامیدا : ئاد + یشا - ئادیشا

لە ئاوێستادا : ئەیشام

٢ـ لە کرمانجیی ژووروودا بە واتای (بەڵێن ، پەیمان ، گفت ، سۆز... سوێند ، سۆند ، سووند...) بەکاردەبرێ، کە ئەویش لە (عهد)ی عەرەبییەوە وەرگیراوە .

عەمەر بهیست سیرەتێ کالەمێرا

ئاد و قەرارێ جاهلی کوردا

(عەمەری جەلالی)

سۆندەك خوەرییە ، ئادەك پێرا ـ پەی ئەسەدێ ـ ئاغێ ، حەمزۆیێ

زەڤارا گرێ نادەم کوفییا زێرا ، کل بەلەك چەعڤا

(ستران)

٣ـ بە واتای (دورگە)

لە فارسیدا : أداك

باڤی گۆت : لاوۆ ، گلی دکن ، کو ل ئۆرتا بەحرێ

ئادەك هەیە ، ل وێ ئادا پاشاك هەیە .

(کوردۆ)

## ئـاخ :

وەك دوو وشەی هاوبێژ لە کاردایە

١ـ :

أ) بۆ دەربڕینی خەم و خەفەت و کەسەر و پەژارە و بێزاری و ناڕەزایی و ناخۆشی و کڕووزانەوە .

لە ئاوێستادا : ئەختی

لە کوردیدا ئەم وشانە هاوواتاین = ئاخ ، ئۆف ، ئۆی ...

ئاخ چ دەردێکی گرانە بۆ گەلی کوردی هەژار
قەت بە دەم ناکرێ بەیانی هێندە سەخت و کاری‌یە

(بێکەس)

ئۆف هەزار ئۆف ئاخ هەزار ئاخ تا قیامەت ئاخ و داخ
من کە سنگم بەردە طەبعم بەرزە چەشنی شاخ و داخ

(گۆران)

مەمێ گۆت : ئەز نەهێرم تو میرەکی دینی
تو زەلامەکی فەقیری ، ژ چ ئاخ و کەسەران بەسەر دلێ خوەدا دکێشێ

(مەمێ ئالان)

ب) داخ ، مخابن ، حەیف ... حەیف و ئەسەف

خەنجەر بۆ دڵە گەر ڕاستت دەوێ
ئاخ مەمی تیایە نەك بەری کەوی

(پیرەمێرد)

بیٚ تەوەر کریا خەتەنە سووران

ئاخ چەند بیٚوەفان ئی چەرخی دەوران

(لەیلیٚ و مەجنوون)

## ئیدیۆم :

ئاخ ئو ئەمان - کڕووزانەوە لە دەست نەخۆشی

ئاخ ئو کەسەر - ئاخ و داخ لە تینی ماتەمی

ج) ئا ، ئاه ... خۆزگە و ئاواتخواستن :

ئاخ ، خۆزگە هەڵئەفڕی ، ئەمزانی ئاخۆ

ڕاسپێری چیی پێیە بۆ گیانی پەشێو

(گۆران)

ئاخ ویٚ کەنگیٚ بیٚ بەربانگ

ببە شەبەق و سبە

(شکۆی حەسەن)

## پەندی پێشینان :

ئاخ زۆرە پەی زاتیٚ - خۆزگە ئەم هێزە زاتێکی لەگەڵدا دەبوو.

د) ئا ، ئای ... نکەنکی نەخۆش لە کاتی ئێش و ئازاردا ... هاوار لەبەر ئازار

ه) ئۆی . بۆ سەرسوڕمان :

ئاخ لەگەڵ ئێمە (حەبیبە) سەر و پەیوەندی نییە

نەی شەکەر قەددە ، بەڵا بەندی هەیە قەندی نییە

(نالی)

٢ـ لـه كرمـانجيى ژووروودا بـه مانـاى (خـاك ، خۆڵ ، گڵ ، تـۆز ، ئـەرد ، هـەرد ، عـەرد ، ئـەرز ، عەرز ، زەوى ، زەمين ...) دێت :

ئاخا قەدەما موحتەرەما پايى پـەر مە
وەك طوطى پەياپەى ل زبان شەكەرى مە

(جزيرى)

ڕۆژەك ژ ڕۆژێن خوەدێ ، ئەمێ سەرێ خوە دەنين
ديارێ ڕەحمەتێ ئاخا گۆڕانە

(مەمێ ئالان)

## ئيديۆم :

ئاخسـار - خـاكى سـارد و سـڕ . ئاسـوودەى هەميشەيى . سارد و سڕيى گۆڕ.

ئاخ كـەفتن = چوونـە ژێـر گـڵ . لـە گـۆڕدا ڕاكشـان . مردن

ئاخێ گۆڕدا حنەكرى = بە گڵى گۆڕ خەنەكراو

## تێبينى :

ئەمڕۆ وشەى (ئاخ) لە دياليٚكتى خواروى كورديدا، تـەنيا لـە چـەند وشـەييٚكى كـەمى ناسـادەى وەك (ئاخـەليٚوە ، ئاخـەبان ، ئاخـەپوولكانێ ، ئاخـەباران ، بناخـە ...)دا بـەرچاو دەكـەوێ ، بـەڵام لـە ديـاليٚكتى

ژوورووودا وێڕای بە تەنیا بەکارهێنانی (چ لە زوودا و چ ئەمڕۆ) لە چەندین وشەی لێکدراوی ، وەك (ئاخلێقە ، ئاخەبان ، ئاخەبانی ، ئاخپین ، ئاخچە ، ئاخپەرست ، ئاخکۆلك ...)یشدا بەدی دەکرێ .

## ئازاد :

ئاوێستا :ئازاتە

پەهلەوی : ئازات

واتاکانی :

١ـ ڕزگار ، سەربەست ، سەربەخۆ ... :

أ) یەکێك بەند و دیل و ئێخسیری یەکێکی دی ، یان شتێك نەبێ :

لە بەهەشتا بە یادی تۆ شادم

بە تەماشای فریشتە ئازادم

(پیرەمێرد)

د باغێ لەفظ و مەعنایێ

(سخن) من سەری ئازادە

(جزیری)

سا دەی وەجامێ دڵم بکەر شاد

بەڵکو بۆ یاروو بەزمی وە ئازاد

(مەولەوی)

ب) میللەتێك یان وڵاتێك لە ژێر دەستی بێگانەدا نەبێ و خۆی حوكمی خۆی بكا ، واتە سەربەخۆ بێ:

كاتێ جەژن ئەكەم بگەم بە مراد
میللەتم شاد بێت ، نیشتمان ئازاد
(بێكەس)

٢ـ ڕاهی ، سەربەست ، ئاواڵە ، ئاوەڵا ، واڵا ، وازە... :

أ) ئافرەتێك ڕووی خۆی دانەپۆشێ و شەرم لە پیاوان نەكا .

ب)هەر كەسێك لە هەڵسوكەت و مامەڵەی لەگەڵ خەڵكیدا شەرم نەكا و واڵا و كراوە بێ .

٣ـ بێتاوان ، بێگوناه ، بێسووچ ، بێخەتا ...

## ئازار :

لە زمانی كوردیدا چوار وشەی (ئازار)ی هاوبێژ دەبینرێ :

١ـ لە پەهلەویدا : ئازار

بەم مانایە :

أ) ئێش ، ژان ، ئێش و ژانی ئەندامی لەش بە هۆی نەخۆشی و برینداریيەوە :

سەری كاكە مەمی دەگرت ، داینا لەسەر ڕانیە

دەڵێ : ڕۆڵە بە قوربانت بم کوێت دێشێ ئازارت چییە
ڕۆڵە چاکە بابت ئازارت بزانێ
(تحفەی مظفریة)

ب)جەزرەبە ، سزا ... ئێش و ژانی ئەنجامی شتێکی ئازاردەر، وەك : گستن ؛ لێدان ، کەوتن ... :

ئەو کوردانەی کە چەند مانگێ لەوە پێش لەشکری ئێرانی ئازار و چەرمەسەری یێکی زۆریان دابوونێ ... .
(قەڵای دمدم)

دەم دەم کە دەکا زاری پڕ ئازاری بە غونچە
بۆ دەعوەتی ماچی لەبە گۆیا دەمی نادا
(نالی)

ج) ئەزیەت ، ئەزێت ، عەزیەت ، عەزێت ، ڕەنج ، تەقەلا ، کۆشش ، هەوڵ ، وەزەن ... ئێش و ژانێکی مرۆ پاش کارکردن و ماندووبوون هەستی پێدەکا .

د) پەژارە ، خەم ، خەفەت ، تاڵاو ، دەردیسەری ، ناخۆشی ... ئێش و ژانی دەروونی :

کوشتەی نازی خۆت زۆر مەدە ئازار
زولفت نەبێتە پەرژینی ڕوخسار
(پیرەمێرد)

محنەت و جەورا حەبیبێ
قەهر و ئازارا ڕەقیبێ
(جزیری)

تێبینی :

زۆر جار لەگەڵ وشەی (ئازار)دا ، وشەی (ئێش ، ژان ، خەم ، دەرد ...) دێت و دەوترێت : (ئێش و ئازار ) ، (ژان و ئازار) ، (خەم و ئازار) ، (دەرد و ئازار) ... وەك :

نازانم چۆتە کام دێ ، کام هەوار
چۆن منی جێهێشت بە ئێش و ئازار
(بەختیار زێوەر)

ژان و ئازار پتر شاناویان بۆ ژنە هێنا ...
(ژانی گەل ، ل ١١)

لە دنیای بێبنی غەمدام ، سەرم سوڕماوە لەم کارە
کە دڵداری و شەرابی مەستی بۆ من دەرد و ئازارە
(ئیحسان فوئاد)

٢ــ بە واتای :

أ) ئاهۆ ، پەتا ، درم ... نەخۆشیی گیرۆ ؛ نەخۆشیی ئادەمیزاد کە زوو تەشەنە دەکا و خەڵك زۆر دەکوژێ ، وەك : کۆلێرا ، تاعوون ...

دەوترێ : ئازار کەوتووەتە وڵاتەوە

ب) قڕ ، دەرد ...

دەوترێ : مریشکەکان ئازاریان تێکەوتووە

٣ـ لە کرمانجی ژووروودا بە واتای :

أ) گریە ، کورك ، کورکە ...

ب) پڕتەوبۆڵە ، هاوار ، قیژە ...

٤ـ بە واتای (ئادار) ـ واتە مانگی مارت

بە عەرەبی (اذار)ە و لە سوریانییەوە وەریان گرتووە

هادار ، مارت ، مارس ... دەبنە هاوواتای

هەر ساڵێك لە ڕۆژی جێژندا ، لە بیست و یەکی ئازارێدا

مەجلیسی عەشیرەتی بەرۆدار لە دیوەخانی کۆدەبنەوە .

(قەڵای دمدم)

## ئاب :

فارسیی نوێ : اب

فارسیی کۆن : ئاپی

ئاوێستا : ئاپ

سانسکریتی: ئاپە

کوردی : ئاو ، ئاڤ

وشەی (ئاب) لە ئەدەبی کوردیی زوودا زۆر دەبینرێ :

سروشکم ئاب و دانەی نارە ، کێ دی

بە حەرمی داوەری بەم طەرزە تەرزە؟!

(نالی)

ئاگر د ئاب و گل دكت
قەلبان ژ قەلبان هل دكت
(جزیری)

ئاب ئەسرین - ئاوی ئەسرین ، ئاوی فرمێسك :

بە ئاب ئەسرین شەو زیندەداران
بە دوعای خوفیەی طاعەت گوزاران
(فەقێ قادری هەمەوەند)

ئاب تەڵا - ئاوی زێڕ :

ئۆسای هونەروەر تەختەی سیم و ساف
مونەققەش بە ئاب تەڵا بێ خیلاف
(لەیلێ و مەجنوون)

ئاب حەیات - ئاوی ژیان

(نالی) ئوستادەكی گەلێ چا بوو
حضری ئابی حەیاتی مەعنا بوو
(حاجی قادری كۆیی)

ژ عنایەت نەظەرێ (خاصە) كو هەر مەصرەع و بەیتەك
قەدەحێن ئابی حەیاتینە د شعرا مە لە بالەب
(جزیری)

ئابی حەیوان - ئاوی حەیات ، ئاوی ژیان :

هیجری ئەمڕۆ شەوقی دیداری بەسەردا كەوتووە
تەشنەیی دیداری تۆیە ئابی حەیوانی دەوێ
(كوردی)

زاری تۆ گوڵزارە خۆ ، بۆچ ئابی حەیوانی هەیە ؟
سەروی تۆ ئازادە ، بۆچ نارنج و ڕوممانی بەردەدا ؟
(وەفایی)

ئابی زەلال - ئاوی پاك :
ئافتابە و لەگەن چەتەڵای بێغەش
پڕ ئابی زەڵال چون شیری بۆنخۆش
(لەیلێ و مەجنوون)

...هتد .

(ئاب) ئێستا نە لە زمانی ئاخاوتن و نە لە زمانی نووسیندا بە تەنیا بەکارناهێنرێ ، بەڵام لە پۆنانی وشەی ناسادەدا بەشداری دەکات . بەوێنە : ئابڕوو؛ ئابخانە ، تیزاب .

(ئاب) بە واتای ناڕاستەوخۆش بەکاردێ ، بە تایبەت لەم حاڵەتانەدا :

أ) کاتێ پاشگری (ـ دار)ی دەخرێتە سەر واتای (بریسکە ، بریقە ، ورشە ، ڕەونەق) دەگەیەنێ:
یەمی دیدە پڕ لە مەرجان ، وەك یەشمی ئابدارە
شەبەیە شەبیهی زوڵفی سیاهی وەك زوخاڵی
(نالی)

دا بە کەمەر گاش شەمشیر ئابدار
دوو نیم بی خەطەر بەوێنەی خەیار
(فەقێ قادری هەمەوەند)

ب) دەمێ وشەی وەك (تاب ، ڕەنگ ...)ی بە دوادا

دێ ، واتای (ڕازاوە ، ڕەونەق) ڕادەگەیەنێ :

ئاب و تاب :

دولبەر ... بۆ جوانی پەردەی گوڵداری بە ئابوتابی بە نێو ڕەشماڵدا گێڕابوو ...

(قەڵای دمدم)

ئاب و ڕەنگ :

بە ئاب و ڕەنگ و ڕوو حۆری ، بە زولف و کاکۆڵی غیلمان
گوڵاویان دا لە مەیخانە ، غوباریان عەنبەر ئاسا کرد

(وەفایی)

## تێبینی :

هەرچی وشەی (ئاب) = هەشتەم مانگی ڕۆمی‌یە ، بووەتە هاوبێژی (ئاب)ەکەی خۆمان .

ئەم بە لاتینی (AUGUSTUS)ی پێ دەوترێ و بە ناوی(ئاوگوست)ی ئیمپراتۆری ڕۆمەوە ناونراوە ...

ئەو لە مانگی ئابدا لە دایك بووە ...

–ماوێتی –

